# کۆیلایەتی لە ئیسلامدا

نوسینی: شاوازی

کۆیلایەتی وەك سیستەمێکی باوی نێو کۆمەڵگاکان مێژوویەکی قوڵی هەیە و ڕۆچووەتە نێو ناخی مێژوو، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری بووە، بازاڕێکی گەرم و کاڵایەکی بە نرخ بووە بۆ خاوەنەکەی، مرۆڤی کۆیلە تەواوی ئازادییەکانی لێ زەوت کراوەو کراوەتە ئامێرێکی بێ گیان بۆ خزمەتی خاوەنەکەی، هەموو ئەرکێکی بەسەردا سەپێنراوە بە بێ بوونی هیچ ما فێك، بەڵکو هەندێك جار بۆ کەیف وەرگرتن لە مەیدانی تایبەتی زۆرانبازی کۆیلەکان بە شەڕ دراون هەتا کۆتایی بە ژیانی یەکێکیان نەهاتبێت بەردەوام بوون لە شەڕ کردن بەبێ ئارەزووی خۆیان، خوێنیان بە هەدەر چووە بەبێ ئەوەی دینێك یاسایەك ویژدانی یەك ڕێگری بکات لەم کارە قێزەونە، ئەم دیاردەیەش لە هەموو کۆمەڵگاکانی ئەو سەردەمەی پێش ئیسلام بوونی هەبوو بە هەندێك جیاوازی کەمەوە، هیچ کۆمەڵگایەکی لێ بەدەر نەبووە، هەریەکە لە دوو گەورە ئیمپراتۆریەتەکەی پێش ئیسلام کە ڕۆمانی و فارسی بوون بە شێوەیەکی بەربڵاو چینایەتی تیایدا گەشەی سەندبوو بە جۆرێك مرۆڤەکان دابەش بوو بوونە سەر چەند چینێك، خراپترین و بێ مافترینیان کۆیلەو بەندەکان بوو کە ڕێژەیەکی زۆری کۆمەڵگاکانیشیانی پێك دەهێنا، ئیمپڕاتۆریەتی چین لە ڕۆژهەڵاتەوە لەمان حاڵی باشتر نەبوو. کۆمەڵگای جاهیلی نیمچە دورگەی عەرەبیش ئەم دیاردەیەی

تیادا بەربڵاو بوو، بازاڕی گەرم گوڕی بۆ دانرا بوو، یاساو سیستمی ستەمكارانە دانرابوو لە بەرژەوەندی خاوەن كۆیلەكان بە جۆرێك بەرپرسیار نەبێت بەرامبەر هەر ئەزیەت و ئازارێك كە توشی كۆیلەكەی بكات تا حاڵەتی كوشتنی، چەوساندنەوە و ئازاردانی كۆیلەكان یەكێك بووە لە داب و نەریتی ئەو كۆمەڵگایانە بەشێوەیەك نانی كەمیان پێدەدان ئەوەندەی بتوانن بژین و لە شوێنی زۆر پیس دەیانخەواندن كە جێگای مانەوەی ئاژەڵان بووە، تەنانەت لە كاتی كارپێكردنیشیاندا دەست و پێیان بە كۆت و زنجیر دەبەسترایەوە و بەر قامچی دەدران نەوەك هەڵبێن یان كاری باش نەكەن، هەركات خاوەنەكەی بیویستایە سزایان بدات ئەوا داخ كردن یان بەشێك لە جەستەی لێدەكردەوەو هیچ كەسێك لۆمەی نەدەكرد بەڵكو هەندێك جار مایەی دەستخۆشی كردن بووە لە خاوەنەكەی.

ئازاری ئەم چینە لە مرۆڤ لەبیركراو بووە و هیچ كەسێك هەستی پێنەكردووە، ڕۆژێك لە ڕۆژان بیر نەكراوەتەوە كە بۆچی ئەم مەخلوقە كە لەشێوەی خۆیانەو خاوەن هەست و شعورە بەم شێوە دڕندانە ئازار دەدرێت و دەخرێتە ژێر باری قورس و گران، رۆحیان بێ بایەخ سەیر دەكرێت.

كۆمەڵێك هۆكار لە ڕابردوودا بوونەتە هۆی بەكۆیلە كردنی مرۆڤەكان لەوانە:

1- جەنگ: مرۆڤ بەشێك لە سیفەتی شەڕانی لە ناخیدایە و ئەگەر دینێك یان یاسایەك جڵەوگیری نەكات ئەوا كاولكاری بەرهەمدەهێنێت، جەنگكردن لە نێوان نەتەوە و هۆزەكان لە ڕابردوودا ڕوویداوە بە هەر بیانوویەك كە تیایدا

مرۆڤگەلێکی زۆر سوتماکی ئەو جەنگانە بوون، خەڵکانێکی تریش سودمەند، ئەو کەسانەی کە بوونەتە دیل لەم جەنگانەدا کراونەتە کۆیلەی سەرکەوتوانی جەنگ، کەواتە دیلی جەنگ یەکێك بووە لەسەرچاوە سەرەکی یەکانی کۆیلەکردن، هەندێك جار ئەم جەنگانە ئامانج تەنها کۆیلە کردنی بەرامبەر بووە.

2- هەژاری و قەرزاری: ئەم دوو دەردە لە کۆن و نوێشدا هۆکارێکن بۆ بەکۆیلە کردنی مرۆڤەکان بە جۆرێك قەرزارەکە توانای دانەوەی قەرزەکەی نەبووە، خاوەن قەرزەکەش کردوویەتی بە کۆیلەی خۆی و یاسای ئەو کات ڕێگای پێداوە.

3- کوشتن و دزی: لە هەندێك لە کۆمەڵگاکان کوشتنی مرۆڤێك یان دزی کردن بکەرەکەی کردووەتە کۆیلە.

4- ناڕەزایەتی دەربڕین بەرامبەر سەردارو خانەدانەکان سزاکەی بە کۆیلە کردن بووە، ئەمەش بۆ ئەوەی هەرچی دەکەن و دەبەن کەس بەرهەڵستیان نەوەستێت.

5- باوك بۆی هەبووە ڕۆڵەکانی بفرۆشێت و بیانکات بە کۆیلە.

6- ئەو مناڵانەی کە لە کۆیلەیەکەوە لە دایك بووە ڕاستەوخۆ دەبووە کۆیلەی خاوەنی باوکی.

7- فڕاندن و ڕێگری و چەتەیی هۆکارێکی تر بووە بۆ بە کۆیلە کردن.

هۆکار ی تری لاوەکی هەبوون بۆ بەکۆیلە کردن کە جیاواز بوون بە جیاوازی داب و نەریتی کۆمەڵگاکان.

کاتێك ئیسلام هات کۆیلایەتی لە جیهان و نیمچە دورگەی عەرەبی واقیعێك بوو هیچ کەس نەیدەتوانی نکۆڵی یان دژایەتی ئەو سیستەمە بکات، تەنانەت کۆیلەکان خۆیان ئەو هەستەیان بۆ دروست کرابوو کە ئەوان مرۆڤ نین بەڵکو تەنها بۆ خزمەت خولقاون، ئەمەش لەبەر ئەوەی هەندێکیان چاویان بە کۆیلەیی بە ژیان هەڵهێنا بوو لە لاشعوریاندا چەسپاو بوو کە بۆیان نیە جگە لەم ژیانە ژیانێکی تر داوا بکەن یاخود هەوڵی بۆ بدەن. ئاینی ئیسلامیش پێویستی بە کاتێکی زۆر بوو تاوەکو ئەم هەستە لە هەستیاندا بسڕێتەوە، خۆیان و پاشان دەورەوبەرەکەیان تێبگەیەنێت کە ئەمانیش مرۆڤن و خاوەن هەست و سۆز و غەریزەن، ئاژەڵ نین و نابێت وەك ئاژەڵیش مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت، ئەم دەسپێکەی ئیسلام بۆ کۆیلەکان دەسپێکێکی باش بوو چونکە توانی مرۆڤ بوونی خۆیان بۆ بسەلمێنێت و حەزو ئارەزوو بۆ ژیانێکی ئازادانە لە ناخیاندا بچەسپێنێت و لە دوایشدا ڕێگاکانی ئازاد کردنی بۆ ئاسان کردن، ئەوان و گەورەکانیشیانی تێگەیاند کە ئازادی مافێکە خوای گەورە بۆی فەراهەم هێناون و هیچ کەس و سیستەمێك ناتوانێت ئەو مافەیان لی بسێنێت.

ئیسلام هات بۆ گەڕانەوەی شکۆو ڕێز بۆ مرۆڤەکان هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت [وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ] الإسراء: 70 واتە ئێمە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرتووە، دیارە ئەم ڕێزەش گشتی یە و هیچ چین و تاقمێکی لیّ جیانەکراوەتەوە، کەسی بەسەر کەسی تردا نەکردووەتە گەورەو سەردار، بەڵکو بە تەواوەتی دژایەتی خۆی بۆ چینایەتی دەربڕیوەو مرۆڤەکانی لەبەرامبەر ئەرك و مافەکاندا

یەکسان کردووە، بەرپرسیاری کردوون بەرامبەر ئەو یاساو ڕێسایانەی دابەزیوەتە سەریان، مافی قیامەتی لە بەهەشت و جەهەنمی بەیەکسانی پێ ڕەوا بینیون وەك خوای گەورە دەفەرموێت [مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ] النحل: 97 واتە : هەر کەسێك کردەوەی چاك ئەنجام بدات لە نێر و مێ بەمەرجێك باوەڕدار بێت، ئەوا توشی ژیانێکی ئاسودەی دەکەین لە دنیاو لە قیامەتیش بە پاداشتێکی باش پاداشتی دەدەینەوە، کەواتە تەنها مەرج بۆ پاداشتی قیامەت ئیمانداری یە نەك نێرو مێی یان کۆیلەو سەرداری. دیارە ئەمە هاندەرێکی باشی ویژدانی بوو بۆ ئەم چینە مافخوراوە تا هەست بە مرۆڤ بوونی خۆیان بکەنەوە لەم ئاینە تازەیەداو، هەر ئەمەش بوو هۆی شوێنکەوتنی زۆرێك لە کۆیلەکان بۆ ئیسلام و پیشاندانی تەواوی گیانفیدایی بۆی.

خوای گەورە بە پەیامی قورئان ئەو هەڵەتێگەشتنەی موسڵمانانی ڕاستدەکردەوە سەبارەت بە کۆیلەکان و تێیدەگەیاندن کە کە ڕێزو کەرامەتی مرۆڤ لای خوا بە لە خواترسانە نەك بەدەسەڵات و دەوڵەمەندی و مناڵ زۆری، خوا گیان دەفەرموێت [إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ] الحجرات: 13 واتە بەڕێزترینتان لای خوای گەورە ئەوەتانە کە زیاتر لە خوا دەترسن، ئەمانە هەمووی ڕێخۆشکەرێکی باش بوون بۆ تێگەشتنی کۆیلەکان و هەستکردنیان بەمرۆڤ بوونی خۆیان لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە ئەو خەڵکانەی تری تێگەیاند کە کۆیلەکانیش مرۆڤن هەروەك خۆیان و هیچ جیاوازی یەك نی یە لە

نێوان ئەمـان و بەردەستەکانیان. ئەم شعورەی کە دروست بـوو بۆ کۆیلە کـان هانیـدان بیـر لە ئـازاد بـوونی خۆیـان بـکەنەوە و ئەمـانیش ژیـانێکی ئـازادانەو سەربەرزانە بژین. .

دیـاره ئیسـلام هەرلە سـەرەتاوە بـاوەڕی بە ئـازادی مرۆڤەکـان هەبـووە و دژایەتـی چینـایەتی کـردووە، لەبەرئەمەش هەستاوە بە دانـانی کۆمەڵێك ڕێکـار و بنەما بۆ ئازادکرنیان، تێکەڵ بوونی ئەم دیاردەیە لە کۆمەڵگای ئەو کـاتەی نیمچە دوورگەی عەرەبـی ڕێگـر بـووە لەوەی کە ئیسـلام نەتوانێـت ڕاسـتەوخۆ ئەم دیاردەیە بنەبڕبکات هەروەك چۆن هەندێکی تر لە حەڕامکراوەکانی بە پلەبەندی حەڕام و قەدەغەکـرد، کۆیلەیەتیشـی بە هەمـان شـێوە وورده بنەبڕکـرد، بەڵام بەیەکجـاری بە دەقێکـی ڕوون قەدەغەی نەکـرد هەروەك چـۆن مەی قەدەغەکرد. بە هاتنی ئیسلام هەموو سەرچاوەکانی کۆیلەیەتی قەدەغەکرد یەك سەرچاوە نەبێت ئەویش دیلی جەنـگ بوو، هۆکاری قەدەغە نەکردنـی ئەم جۆرە لە سەرچاوەی کۆیلایەتی بەیەکجاری دەگەڕێتەوە بۆ باوی ئەو کـاتەی جەنـگ کە هەر لایەك سەرکەوتووی جەنگ بوایە بۆی هەبوو هەموو دیلەکان بکاتە کۆیلەو کەنیـزەك، هـیچ یاسـاو سیسـتەمێکیش لـۆمەی ئەمەی لێنەئەکـردن، دەوڵەتـی ئیسـلامیش کە لە سـەرەتای دروسـت بـوونێتی و ڕووبەڕوی جەنـگ و شـەڕی کافرەکـان دەبێـتەوە و لە هەردوولا دیـل بـوون ڕوودەدات، دیـارە مـایەی سـنگ فراوانی نیە هێزی بەرامبەر دیلی موسڵمانان بکەنە کۆیلەو کەنیزەك لە کاتێکدا موسـڵمانان دیلەکـانی ئەوان نەکەنە کـۆیلە، ئەم کـۆیلەکردنە لەسـەر بنەمـای

(المعاملــة بالمثـل) واتە هاوشـێوە هەڵـس و کەوت کـردن ئەنجامـدەدات، خـوای گەورەش دەفەرموێت [فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْـهِ بِمِثْلِ مَـا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ] البقرة: 194 واتا هەرکەسێك تەعەدای لێکردن ئەوا ئێوەش بۆتان هەیە بە هەمان شێوەی ئەوان بەرهەڵستی ئەو تەعەدایەی ئەوان بکەن و وەك خۆیـان مامەڵەیـان لەگەڵ بکەنەوە، ئەم کۆیلە کردنە ڕێگریەکـی بـاش بـووە لە هاندانی کافرەکـان بـۆ شـەڕ دژی موسـڵمانەکان و ترسـتاندنیان لە ڕووبەڕوی موسـڵمانان، هەرکـاتیش بەرامبەر دژی بە کۆیلەکردنی دیل بوبێت ئیسلام زیاتر ئەو بنەمایەی جـی بەجـێ کردووە، لەبەرئەمەش لەسەردەمی "محمد الفاتح" پەیماننامەیەك مۆر کرا لەگەڵ دەوڵەتانی ئەوکات کە ئیتر نابێت دیلـی جەنـگ بکرێتە کۆیلە، لەو کـات تـا ئێستا بەشێوەیەك لە شێوەکان ئەم پەیماننامەیە پەیڕەو دەکرێت، ئەمەش مانـای پەرۆشـی ئیسلامە بۆ دژایەتیکردنی کۆیلەیەتی و ڕاکێشانی دەستی ئازادیخوازانەی ئیسلامە بۆ ئازادکردنی مرۆڤەکان، کەواتە هۆکاری تەواو بـۆ حەرام نەبـوونی کـۆیلەیەتی دیلی جەنگ بە یەکجاری ئەوەیە کاتێك دوژمنانی ئیسلام دیلی موسـڵمان بە کـۆیلە بکەن دەبێت موسـڵمانانیش هەڵـس و کەوتێکـی هاوشێوەی ئەوان پەیڕەو بکەن بـۆ چاوترسـاندیان لە جەنگکـردن یـان لە بە کـۆیلە کردنـی دیلـی جەنـگ. کە ئێسـتاش لەو سـەردەمەدا بە کـۆیلەکردنی دیلـی جەنـگ نەمـاوە ئەوا ئیسـلامیش لەگەڵ ئەو هەنگـاوەدایە و تەنـانەت زانایـانی ئیسـلام لە کۆنیشـدا فەتـوای ئەوەیـان داوە کە ئاساییە پەیماننامە لەگەڵ بەرامبەرەکانـدا مـۆر بکـرێ لەسـەر ئەوەی دیلـی جەنـگ بە کـۆیلە نەکـرێ و موسـڵمانان پابەنـد بـن بەوە، کەواتە دەتـوانین بڵێـین لە حـاڵی

حازر لەبەر ئەوەی گشت دەوڵەتەکان پابەندن بە کۆیلەنەکردنی دیلی جەنگ ئەوا ئەو سەرچاوەیەی کۆیلەکردن نەماوە لە روانگەی ئیسلامەوە.

لێرەدا دەپرسین ئەگەر کافرەکان هەر هەڵس و کەوتێکی ناشیاو لەگەڵ دیلی موسڵمانان ئەنجامبدەن دەبێت موسڵمانان بە هەمان شێوە مامەڵە بکەین؟؟ نەخێر.. چونکە هەندێك هەڵس و کەوت لە ئیسلامدا حەڕامکراوە و بڕاوەتەوە وەك ئازاردانی دیلی جەنگ یان برسی کردنیان یان کاری ناپەسەندکردن لە گەڵیان وەك نێربازی بۆ نمونە، دیارە ئەمانە حەڕام کراون لە ئیسلامدا کە ئەگەر بەرامبەریش ئەنجامی بدات نابێت موسڵمان ئەنجامی بدات.

ئەگەر بەراوردیش بکەین لە نێوان ئەوەی لە حاڵی ئێستادا دەکرێ لە هەندێ جۆری نوێی کۆیلەکردن و مامەڵەی خراپ لەگەڵ دیلەکان و خستنە ناو زیندانەکانی گوانتانامۆ و ابو غریب یان زیندانی سیستەمە دیکتاتۆریەکانی دونیا.. ئەوا کۆیلە کردن بەو شێوەیەی لە ئیسلامدا هەبووە زۆر باشتر بوو لەو مامەڵەیەی کە لەگەڵ دیلی جەنگ دەکرێت لەو وڵاتانە، کەم ئافرەت شەڕەفی هەتك کرا ؟؟ کەم پیاو لە پیاوەتی خرا ؟؟ کەم مرۆڤ بە کوشتن چوون لە ژێر ناوی ئازادی؟؟ مامەڵەکردنی ئیسلام لەگەڵ دیلی جەنگ تەنها و تەنها کۆیلە کردن نەبووە بەڵکو شێوەو شێوازی تری هەبووە.

وەك وتمان كە تاكە سەرچاوە ئیسلام بۆ بە كۆیلە بوونی مرۆڤ بە یەكجاری حەڕامی نەكرد دیلی جەنگە، دیارە ئەمەش بەبێ قەید و مەرج نیە بەڵكو كۆمەڵێك یاساو ڕێسای بۆ دانراوە، سەرەتا ئەو جەنگەی كە دیلەكانی بەكۆیلە دەكرێت دەبێت جەنگێك بێت لە نێوان موسڵمانان و كافردا ڕوودات، ئەمەش بۆ دوورخستنەوەی ئەو شەڕو خراپەیانە لە موسڵمانان و ڕێگیری لێكردنیانە لە ستەم لە خەڵكی هەژارو بێ دەسەڵات، هەر جەنگێك كە لە نێو دوو گرۆهی موسڵمان ڕوودا نابێ دیلەكانی بكرێنە كۆیلە و كەنیزەك، سەرەڕای ئەمەش مەرج نیە هەموو دیلێكی جەنگی بە كۆیلە بكرێت، نەخێر، ئیسلام هەڵس و كەوتی لەگەڵ دیلی جەنگی بە چوار حاڵەت داناوە لەوانە:

1- ئازاد كردن بەبێ بەرامبەر: ئەمەش وەك منەتێك بەسەریانەوە تا بیر بكەنەوە لە ڕەحمەتی ئەم دینەو موسڵمان ببن، لەم جۆرە حاڵەتەمان لە مێژووی ئیسلامی زۆرە كە بووەتە هۆی موسڵمان بوونی ئەو دیلەی كە ئازادكراوە، خوای گەورەش دەفەرموێت: [فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً] محمد: 4 واتە یان بە منەت یان بە قەرەبوو فیدیە ئازادیان بكەن. پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) لە ڕۆژی ڕزگاركردنی مەككە دا هەموو ئەو خەڵكەی ئازادكرد و كەسی لێنەكردن بە كۆیلە.

2- ئازادکردن بە قەرەبوو و فیدیە: دیلەکە ئازاد دەکرێت بە بڕێك لە پارە یان هەرشتێك نرخی هەبێت، بڕو چەندێتی لە ئیسلامدا دیاری نەکراوە بەڵکو بە جێهێڵراوە بۆ زانایانی ئەو سەردەمە.

3- کوشتن: ئەو دیلەی کە بووەتە مایەی زیانی زۆر بۆ موسڵمانان و وەك بەتەعبیری ئەو سەردەمە پێی دەوترێ تاوانباری جەنگ، و بە تێڕوانینی زانایان و گەورەی موسڵمانان کوشتنی باشترەو بەرژەوەندی زیاترە لە زیندووبونی ئەوا دەبێت بکوژرێت، لە جەنگی بەدردا هەریەکە لە "نضر بن الحارث " و "عقبة بن أبي معيط" دیلکران و پاشان کوژران لەبەر خراپی هەڵوێست و مامەڵەیان بەرامبەر موسڵمانان، خوای گەورەش عیتابی لە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) گرت کە بۆچی دیلە کانی بەدری نەکوشتووە، هەروەك دەفەرموێت [مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي الْأَرْچض] الأنفال: 67 واتە : بۆ هیچ پێغەمبەرێك نیە دیلی هەبێت هەتاوەکو پایەدارو جێگیر دەبێت لە زەویدا. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت [تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيا وَاللَّهُ يُرِيدُ الآخِرَة] واتە ئێوە کەلو پەل و شت و مەکی دونیاییتان دەوێت لە کاتێکدا خوای گەورە قیامەتی مەبەستە، لێرەوە تێدەگەین کە پێدەچێت هاوەڵان لەبەر خاتری دەست کەوتنی هەندێك ماڵ و سامان پێیان خۆش بوو بێت کە دیلەکانی بەدر بە قەرەبوو ئازاد بکرێن تا سودێکی دونیاییان دەست بکەوێت بەڵام خوای گەورە پێچەوانەکەی دەوێت کە کوشتنیانە.

4- به کۆیله کردن: له سونەت و سیرەتی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) هاتووه که خودی خۆی دیلەکانی بەنی قورەیزەی کردووەته کۆیله و کەنیزەك. که ئەوەشیان وەك وتمان لەو سەردەمەدا به گوێرەی رێککەوتنامه نێودەوڵەتیەکان نەماوه ئەوا ئیسلامیش پابەند دەبێ پێیەوه و تەنها له حاڵەتی معاملة بالمثل جێبەجێ دەکرێ.

هەڵبژاردنی یەکێك لەم چوار حاڵەته دەگەرێتەوه بۆ گەورەو پێشەوای موسڵمانان که کامیان له بەرژەوەندی موسڵمانان بوو ئەوەیان هەڵدەبژێرێت، هەرچەنده هەڵوێستی کافران بەرامبەر دیلی موسڵمانان به هەند وەردەگیرێت، که ئایا ئەوان به چ شێوەیەك مامەڵه دەکەن، ئایا دیلی موسڵمانان دەکەن بەکۆیله؟ یان دەیکوژن؟.. بەهەمان شێوه پێشەوای موسڵمانان به نمونەی مامەڵەی ئەوان مامەڵه دەکات.

ئەوەی کێشەیەو بووەته جێگای گومانی هەندێك کەس به کەنیزەك کردنی ئافرەتانی دیله لەلایەن موسڵمانانەوه، ئەمەش به زەوەت کردنی ئازادی مرۆڤەکانی دەزانن..

یەکێك لەو گومانانەی دروست دەکرێت لە لایەن ناحەزانی ئیسلام و حاڵی نەبووانی نێو ئەم پەیامە شکۆدارە بابەتی کەنیزەکە (ملك اليمين)ـە، هەرچەندە ئێستا باسێکی لەو جۆرە بوونی نیە و کۆتایی هاتووە و ئاینی پیرۆزی ئیسلام توانی بە کاتێکی دیاریکراو بنەبڕی ئەم دیاردەیە بکات بەڵام هێشتا دوژمنانی ئیسلام ئەم بابەتانە دەهێننەوە نێو باس بۆ تانەدان لە ئیسلام و بە پێشێل کردنی مافی مرۆڤی لە قەڵەم دەدەن. ئێستا دەپرسین ئایا ئەو ئافرەتە کێ یە دەبێتە کەنیزەك و بۆ؟؟ مافی چیە لای خاوەنەکەی؟؟ چۆن ئیسلام ڕێگای سەرجێی بە خاوەنەکەی داوە؟؟ کەی دەتوانێت ئازاد بێت؟؟ ئایا کەنیزەك وە ئافرەتی ئازاد ڕووبەڕی هەمان ئەرکی ئیسلامی دەبنەوە؟؟ ئەمانە پرسیار گەلێکن پێویستیان بە وەڵامە کە پشتیوان بە خوا وەڵامی دروستی ناحەزانی ئەم پەیامە شکۆدارە دەدەینەوە سەبارەت بەم پرسیارە.

وەك باسمان کرد کە تاکە سەرچاوەی بە کۆیلە کردن ئیسلام بە یەکجاری حەرامی نەکردووە دیلی جەنگە، باسی ئەوەشمان کرد کە بۆچی ئیسلام ئەم سەرچاوەیەی بە ڕوونی قەدەغە نەکرد، لە کۆندا ئەو ئافرەتانەی دەبوونە دیلی موسڵمانان لە جەنگێکی شەرعیدا ئەوا دەکران بە کۆیلەی موسڵمانان واتە دەبوون بە کەنیزەك "دیارە لە هەمان کاتدا ئافرەتانی دیلی موسڵمان لە لایەن کافرانەوە بکرێنە کۆیلەو کەنیزەك"، ئەم بە کەنیزەك بوونە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی نەبوو و هەرکێ بۆ خۆی، نەخێر، بەڵکو دوای تەواو بوونی جەنگ تەواوی ئافرەتەکان کۆ دەکرانەوە کە دیل کراون، هیچ یەك لەو ئافرەتانە بۆ کەس نەبوو دەستیان بۆ

بەرێت تاوەکو وەك دەستکەوتی جەنگی بەسەر بەشداربوانی جەنگدا دابەش دەکران، واتە هەر ئافرەتێك دەکەوتە لای پیاوێکی موسڵمان، لێرەدا دەڵێین ئەگەر ئەو ئافرەتە دیلانە نەخرابانە ژێر ڕکێفی پیاوێکەوە ئەوا دەبوا لە نێو دەوڵەتی ئیسلامی ئازاد بکرابان کە چی یان پێ خۆشە بیکەن بە بێ مەرجی گەڕانەوە بۆ لای کەس و کاریان چونکە ئەوان دیلن، لەم کاتەدا ئەو ئافرەتانە بێگانەن و هیچ ڕێ و شوێنێکی ژیان شارەزا نین، ناتوانن قووتی ڕۆژانەیان پەیدا بکەن، بۆیە مەترسی ئەوە هەبوو بکەونە بەردەستی خەڵکانی خراپەکار تا بە ئارەزووی گڵاویان مامەڵەیان لە گەڵدا بکەن و ئارەزووە سێکسی یەکانیان پێ تێر دەکەن، دوایش بەرەڵایان بکەن، بۆیە ئەم ئافرەتانە تەواوی ڕێزو حورمەتیان دەشکێنرا و دەکرانە ئافرەتانێکی لەشفرۆش، واتە ئەمان هەر دیل نین بەڵکو بوونەتە بوکەڵە بە دەست خەڵکانی داوێن پیسەوە، لەبەر ئەمە ئیسلام هەر یەکێك لەو ئافرەتانەی دەدا دەست پیاوێکەوە کە تەواوی مافی بپارێزێت و بیپارێزێت لە خراپەی هەموو خراپەکارێك، ڕێگای بەو موسڵمانەش دابوو دوای پاك بوونەوەی عیدەکەی بچێتە لای لەبەر بوونی غەریزە لای ئەو ئافرەتە وەك خوای گەورە دەفەرموێت [وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ، إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ] المؤمنون: 5، 6 واتە ئەو کەسانەی کە داوێن پارێزی دەکەن مەگەر بۆ خێزانەکانیان یان کەنیزەکەکانیان، کەواتە کەنیزەك وەك خێزان دەتوانرێ سەرجێی لەگەڵدا بکرێت، مەرجی چوونە لای ئەم کەنیزەکە ئەوە بوو کە شووی نەکردبێت بە موسڵمانێك یان پێشتر کەنیزەکی باوانی یان نەوەی ئەو خاوەنی کەنیزەکە نەبووبێت، ئەمەش بۆ لەبەرچاوگرتنی هەستی ئەو ئافرەتەیە نەك هەر

وەك خزمەتكارێك بێ و كەس لایەك بەلای هەست و شعوریدا نەكاتەوە و لانی کەم ئارەزووە سێكسی یەكانی تێر نەكرێت، هەموو پێداویستی یەكی ژیانی دابین دەكرێت لەلایەن خاوەنەكەیەوە، جا هەركاتێك خاوەنەكەی بیویستبا ئەم كەنیزەكە بفرۆشێت، كڕیار دەبوا چاوەڕێی عیددە بكات پاشان بچێتە لای، ئەو كاتە خاوەنی یەكەمی بۆی نەبوو سەرجێی لەگەڵ بكات چونكە ئەو مافی پێوە نەماوە.. جا ئەم یاسا جوانانە لە كوێ و ئەو بەرەڵایی یە لە كوێ كە لە پێش ئیسلام بوونی هەبووە بە شێوەیەك كە هەموو كەس و كاری ئەو خاوەن كەنیزەكە بۆی هەبووە بچێتە لای و سەرجێی بكەن لەگەڵی.

پرسیارێك ڕووبەرووی دەبینەوە ئەوەیە كە ئەگەر ئەم كەنیزەكە لە خاوەنەكە دوای سەرجێی كردن تووشی حەمل بوو مافی چی یە لەسەر خاوەنەكەی ؟ ئایا ئەو مناڵەی كە دەبێت هەر كۆیلە دەبێت ؟؟

ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆ پاراستنی كەرامەتی مرۆڤەكان هاتووە بۆیە بۆ هەموو ئەو ئەگەرانە ڕێوشوێنی جوانی قەناعەت پێهێنی گرتووەتە بەر، ڕێگری كردووە لە هەموو كات و سەردەمێكدا كە مافی هیچ چینێك پێشێل بكرێت، لەبەر ئەمە هەر كاتێك ئەو كەنیزەكەی لە ژێر ڕكێفی پیاوێكی موسڵماندایە منالّی بوو وە سەلمێنرا كە منالّی ئەو پیاوەیە ئەوە ڕاستەوخۆ ناوەكەی لە كەنیزەكەوە دەگۆڕێت بۆ دایكی منال "أم ولد"، ئیدی بە هیچ جۆرێك بۆی نی یە ئەو ئافرەتە بفرۆشێت و جودای بكاتەوە، بەڵكو هەر بە مردنی خاوەنەكە ڕاستەو خۆ ئەو

ئافرەتە ئازادی خۆی وەردەگرَت. ئەمە جگە لەوەی دەبێت گەورەکەی هەڵس و کەوتنی شیاو گونجاوی لەگەڵدا بکات.

ئەوە مامەڵەی ئیسلام بوو لەگەڵ کەنیزەك لەو سەردەمەداو ئەم ڕێوشوێنانە کاتی بوون و بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی درێژ خایەن بووە، واتا ئێمە باسی سەردەمێك دەکەین کە ئیسلام تیایدا مامەڵەی لەگەڵ واقیعەکەی ئەو کات دەکرد و باسی ئێستا نیە کە نەماوە و شەرعیەتدان نیە بەوەی لەو سەردەمەش ئافرەت بکرێتە کەنیزەك.

سەرەڕای ئەوانە ڕێگاکانی تری ئازادکردنی کۆیلە زۆر بوون کە ئیسلام داینـاوە مەگەر هەر کۆیلە کە خۆی نەیویستبێت ئازاد.

هەر لە بنەڕەتەوە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دژی بە کۆیلە بوونی مرۆڤەکان بووە، هەوڵی زۆری بنەبڕکردنی داوە تا ئەنجام ئەم دیاردەیە بوونی نەماوە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، ئاینی ئیسلام بە چەند هەنگاوێك توانی ئەم دیاردەیە بنەبڕ بکات لە ماوەیەکی کورتدا، کە بەگوێرەی ڕۆچوونە مێژووییەکەی کاتێکی کورت ماوە بووە، لەو هەنگاوانەی بۆ ئازادکردنی کۆیلە گرتوویەتیە بەر بریتیە لە:

1- هەستی مرۆڤ بوونی بۆ گێڕایەوە کە سەردەمێك بوو لێی زەوت کرابوو، تەنانەت ناوهێنانی کۆیلەکان بە عەبد و کۆیلە قەدەغەکراوە بەڵکو دەبێت بڵێیت

کوڕەکەم یان کچەکەم وەك رسول الله (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت (لا يقل أحدكم هذا عبدي وهذه أَمَتـی بل يقل فتـاي و فتـاتي)، ئەوەش گەورەیـی ئیسلام دەردەخا کە ئەم خاڵەمان بە درێژی لە ئەڵقەکانی پێشوو باس کردووە.

2- ئـازادکردنی کۆیلە لە ئیسـلامدا پاداشـتی گەورەی بـۆ دانـراوە ئەمەش بـۆ هاندانی موسڵمان تـا بە هۆی دەستکەوتنی ئەو پاداشتە قیامەتی یەوە گۆمەڵگا لە کۆیلەیەتی ڕزگـاری دەبێـت. خـوای گەورە دەفەرموێـت [فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَـةَ ، وَمَـا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ ، فَكُّ رَقَبَـةٍ] البينـة: 11 - 13 کەواتە بۆ ڕزگـاربوونـی بەربەستە سـەختەکانی دواڕۆژ ئـازادکردنی کـۆیلە لە دونیـا یەکـێکە لە هۆکارەکـان، وە پێغەمبەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێت) روونـی دەکـاتەوە کە هەر کەسێك موسـڵمانێك ئـازاد بکـات ئەوا بەرامبەر هەر ئێسکێکی ئەو کەسـە خـوای گەورە ئێسـەکەکانی ئەو لە ئـاگر دەپارێزێت وەك دەفەرموێ: «أيمـا رجـل أعتـق رجـلا مسلماً، فإن الله يجعل وقاء كل عظم من عظامه عظما من عظام محرره من النـار وأيما امرأة مسلمة أعتقت امرأة مسلمة، فإن الله جاعل وقاة كل عظـم مـن عظامهـا عظما من عظـم محررهـا مـن النـار» النسـائي (4859) أبـو داود (3965) أحمد (18061) ئـایەت و فەرمـوودە زۆرن کە بـاس لە پاداشـتی ئـازادکردنی کـۆیلە دەکەن بەو ئایەت و فەرموودەیە واز دێنین ئێمە.

3- ئـــازادکردنی کـــۆیلە لە کە فـــاڕەتی تـــاوان کە ئەمەش هۆکـــارێکە لە هۆکارەکانی ئازادکردنی کۆیلە لە شەریعەتی ئیسلامی، قورانی پیرۆز بە لە چەند

شوێنێکدا بە دەق دایناوە کە ئازادکردنی کۆیلەی کردووە بە کەفارەتی ئەو گوناح و هەڵانەی موسڵمان پێی هەڵدەستێت، زۆرینەی ئەو گوناح و سەرپێچیانەی کە موسڵمان توشی دەبێت لە ژیانی ڕۆژانەیدا ئازادکردنی کۆیلەیە دەبێتە مایەی سڕینەوەی گوناحەکە، کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ئیسلام هەوڵێکی زۆر دەدات تا ژمارەیەکی زۆر لە کۆیلەکان ئازاد بکرێن لە گۆمەڵگای ئیسلامی، لە نمونەی ئەو کەفارەتانە:

ــ خوای گەورەیە بۆ کەفارەتی کوشتنی هەڵە ئازادکردنی کۆیلەی داناوە لەگەڵ پێدانی دیە بەماڵی کوژراو. خوای گەورە دەفەرموێت [وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰ أَهْلِهِ] النساء : 92.

ـ خوای گەورە بۆ کەفارەتی کوشتنی کەسێك لە گەلێك بێت کە لە نێوان ئەوان و موسڵماناندا پەیمان هەبێت دەبێت کۆیلەیەك ئازاد بکات هەروەك دەفەرموێت [وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰ أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ] النساء: 92.

ــ خوای گەورە بۆ کەفارەتی کەوتنی سوێندێك ئازادکرنی کۆیلەی داناوە، خوای گەورە دەفەرموێت [وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ ۖ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ..] المائدة: 89

ـ خوای گەورە بۆ کەفارەتی ظهار ئەگەر موسڵمان ئەم ووشەی بە دەمداهات و پاشان پەشیمان بووەوە دەبێت کۆیلەیەك ئازاد بکات [وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا. .] المجادلة: 3

ـــ خـوای گەورە بـۆ کەفـارەتی ڕۆژوو شـکاندنی ئەنقەسـت (عمـد) دەبێـت کەفارەتێك بدات ئەویش ئـازادکردنی کۆیلەیە کە ئەمش جێگیربـووە لە سونـەتی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر).

4ـ قەدەغەکردنـی هەمـوو جـۆرە ئازاردانێکیـان بەشـێوەیەك کە هەر کەسـێك دەستی یان لوتـی کۆیلەیەك ببڕێت دەست و لوتـی دەبڕنـەوە یـان چـاوی هەڵبکۆلێت دەبێـت لە بەرامـبەری ئەو تـاوانە چـاوی بـکەری ئەنجامـدەرەکەی هەڵبکـۆڵێتەوە. واتە "الجـزاء مـن جـنس العمـل"، پێغەمـبەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر) دەفەرموێت: " ( من قتل عبده قتلنـاه، ومن جدع عبده جدعناه) واتە هەرکەسێك کـۆیلەیەك بکوێـت دەیکـوژینەوە، هەرکەسـێك کـۆیلەیەك چـاو هەڵکۆڵێـت چـاوی هەڵدەکۆڵین.

5ـ ئیسلام هانی موسڵمانان دەدات کە باش هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکەن و بە بـرا و خوشـکی خۆیانیـان تەماشـابکەن، خـوای گەورە دەفەرموێـت [وَبِالْوَالِـدَيْنِ إِحْسَـانًا وَبِـذِي الْقُرْبَـىٰ وَالْيَتَـامَىٰ وَالْمَسَـاكِينِ وَالْجَـارِ ذِي الْقُرْبَـىٰ وَالْجَـارِ الْجُنُـبِ وَالصَّـاحِبِ بِالْجَنـبِ وَابْـنِ السَّـبِيلِ وَمَـا مَلَكَـتْ أَيْمَـانُكُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِـبُّ مَـن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا] النساء: 36، لە هەر خواردنێکیان خـوارد بەشـی بەردەست و کۆیلەکانیـان بـدەن و هەر پۆشـاکێکیان لەبەر کـرد هەمـان پۆشـاك بـۆ کۆیلەکانیـان بـکەن، کە دیـارە ئەمە ئەو پەڕی یەکسـانی و برایەتـی یە کە ئیسـلام دروسـتی کـردووە لە نێـوان کـۆیلەو گەورەکەی، پێغەمبەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر)

دەفەرموێت (إخوانكم خولكم ملكهم الله إياكم، فمن كان إخوه تحت يده، فليطعمه مما يطعم وليلبسه مما يلبس) واته براكانتان " تێبینی بکە دەفەرموێت براکانتان " خوای گەورە خستویەتی یە بەردەستان، جا هەرکەسێکتان برایەکی لەبەردەست بو و با لەو خواردنەی خۆی دەیخوات هەمان خوارد بۆ کۆیلەکەی دابنێت یان ئەو بۆشاکەی خۆی لەبەری دەکات هەمان پۆشاکیش بۆ کۆیلەو بەردەستەکەی دابین بکات. خوای گەورە لە چەندین ئایەتدا باسی جوان مامەڵەکردن دەکات لەگەڵ کۆیلە کە لەبەر درێژی ئاماژەی پێناکەین.

6- ئیسلام هانی موسڵمانان دەدات کە کاری قورس و پڕوکێنەر نەدات بەسەر کۆیلەکاندا کە لە تواناو ووزەی بەدەر بێت، خۆ ئەگەر کارێکیشی پێ سپارد بەپێی توانا یارمەتی بدات، ئەمە لە کوێ و ئەو مامەڵەیە لە کوێ کە غەیرە موسڵمان ئەنجامیداوە بەرامبەر کۆیلە. پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت "وَلَا تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ" بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە.

7ـ خوای گەورە ڕێگەی دا کە پیاوی ئازادی موسڵمان ئەگەر نەتوانێت ئافرەتێکی ئازاد مارە بکات ئەوا بۆی هەیە لە ئافرەتانی کۆیلەی موسڵمان مارە بکات، وەك دەفەرموێت [وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن َنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ] النساء: 52. هاوسەرگیری کارێکی هەستیارەو ئەو کەسەی دەیەوێت کچێك مارە بکات

مەرجی هاوكوفی دادەنێت واتە دەبێت كچەكە لە هەمان ئاستی كوڕەكە بێت لەڕووی كۆمەڵایەتی یەوە، دیارە ئەم جۆرە مارەكردنانە هەستی یەكسانی بوون لای ئەو ئافرەتە كۆیلەیە دروست دەكات. بەم مارەكردنەش ڕاستەو خۆ ئافرەتەكە ئازاد دەبێت.

8ـ كۆیلەكان مافی كاربەدەستیان هەبووە لە دەوڵەتی ئیسلامی وەك پێشەوا عمر دەفەرموێت "لو كان سالم مولی أبي حذیفة حیاً لولیته" واتە ئەگەر سالمی كۆیلەی ابی حوزەیفە زیندوو بوایە دەمكردە بەرپرس، دیارە ئەم كارەی پێشەوا عمر سەرچاوەی لە فەرمودەكانی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر) وەرگرتووە، كاتێك أسامەی كوڕی زید كرایە سەركردەی سوپایەكی گەورە كە ابوبكر و عمر سەرباز بوون تیایدا، هەندێك كەس تانەیان لەم سەركردایەتی یە دا لەبەر مناڵی و كۆیلە بوونی باوكی لە ڕابردوودا، لەبەر ئەمە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) فەرموی " ئەوەی تانە لەسەركردایەتی اسامە دەدات لەپێشدا تانەی لە سەركردایەتی باوكی داوە، والله اسامە شایەنی سەركردایەتی یە هەروەك چۆن باوكی شایەن بووە ".

9ـ موكاتەبەكردن كۆتا ڕێگای ئازادكردنی كۆیلە بووە لە كۆیلەیەتی، خوای گەورە دەفەرموێت [وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ..] النور: 33، واتە ئەو كەسانەی دەیانەوێت خۆیان ئازاد بكەن لە بەندەكانتان و خۆیان بكڕنەوە ئەوا ئێوە لە گەڵیان

ڕێك بكەون و ڕێگەی ئازادیان بۆ ئاسان بكەن. ئەگەر خێرتان تیادا بە دی دەكردن لەو ماڵ و سامانەی خوای گەورە پێی بەخشیون بەشیان بدەن. ئەم موكاتەبەیە ڕێگەیەكی ئاسانە بۆ كۆیلە كە دەرباز بێت لە كۆیلەیەتی. ئاینی ئیسلام ڕێگای موكاتەبە كردنی بۆ كۆیلە ئاسان كردووە وەك:

1- یەك لە وتاقمانەی كە زەكاتیان بۆ ڕەوایە كۆیلەیە، ئەم پارەیە دەتوانێت بە كاربهێنێت بۆ ئازادكرنی خۆی، [إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ..].

2ـ ئیسلام داینـاوە ئەو پـارەیەی كـۆیلە دەیـداتەوە بە گەورەكەی لە كـاتی موكاتەبە بە شێوەی قیست بێت، پێشەوا بخاری وە ئەبو داود لە دایكە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕنەوە كە فەرمووی بریرە هاتە ژوورەوە بۆ لام و وتی: (إن أهلي كاتبوني على تسع أواق فضة في تسع سنين، كل سنة أوقية، فأعينينى). . واتە خاوەنەكەم دەیەوێت موكاتەبەم بكات بە نۆ ئۆقیە زیو لە نۆ ساڵدا بە شێوەیەك هەر ساڵەو ئۆقیەك تۆ یارمەتیم بدە. .

3- ـ پێویستە لەسەر گەورەی كۆیلە یارمەتی و هاوكاری كۆیلە بدات كاتێك دەیەوێت موكاتەبە بكات بە پێی ئایەتی [وآتوهم من مال الله آتاكم ] واتە لەو پارەیەی خوای گەروە پێیداون ئێوەش بەشی كۆیلەكانتانی لێبدەن لە كاتی موكاتەبە.

جا هەركات ئەم موكاتەبەیە ئەنجامدرا ڕاستەوخۆ كۆیلەكە ئازاد دەبێت و پێویست ناكات گەورەكەی بڵێت ئەوا ئازادم كردی. ئەم ڕایە امامی قورتوبی لە

سەلەفەوە دەیگوێزێتەوە بۆمان. ڕەئی تر ئەوەیە کە دوای پێدانی ئەو پارەیەی ڕێککەوتون لەسەری ڕاستەوخۆ ئازاد دەکرێت.

هەموو ئەم هەنگاوانە بوو کە سەرئەنجام کۆیلەیەتی بنەبڕ کرا لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، ئیتر هەر باس و خواسێك لەم بابەتە بەرامبەر ئیسلام بێ ویژدانی یە چونکە تەنها ئیسلام بوو توانی بە سیستەمێکی ڕێك و پێك دیاردەیەکی مێژووی هەزاران ساڵە بنەبڕ بکات. ئەوەی جێگەی سەرنجە هەندێك کەس وا گومان دەبەن کۆیلەیەتی بنەبڕ بووە لە وولاتانی ئەمریکی و ئەوروپی.. نەخێر، ئەوەی ئێستا دەگوزەرێت کۆیلەیەتی مۆدێرنەیە کە چەندەها خەڵك بوونەتە کۆیلە بە دەست کۆمپانیا زەبەلاحەکانەوە بگرە چەندەها وولات بوونەتە کۆیلەی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی، ئەو وولاتانەی قەرزاری ئەو سندوقەن دەبێت ڕازی بن بەو مەرجانەی لەسەریان دەسەپێنن کە زۆر جار مەرجی زۆر نا مرۆڤایەتین.

لە کۆتاییدا دەڵێین ئەم ئیسلامە پاك و پێگەردە و لە لایەن خوایەکی زانا و ئاگادار بە هەموو سەردەم و شوێنێکەوە هاتووە وگونجاویشە بۆ هەموو ئەو سەردەم و شوێنانەیە بێ جیاوازی.